**Ali-Baba Et Les Quarante Voleurs**

**عەلی بابا**

**و چل چەتە**



**Ali-Baba Et Les Quarante Voleurs**

**عەلی بابا**

**و چل چەتە**

**وەرگێرانی :**

**ئەحمەد شوانی**

IL y avait une fois, dans une ville de Perse, deux frères nommés Kassim et Ali-Baba. Kassim était riche tandis qu'Ali-Baba était pauvre. Pour gagner sa vie et celle de ses enfants, il allait couper du bois dans la forêt voisine, et le ramenait à la ville, pour le vendre, chargé sur trois ânes qui constituaient toute sa fortune.



Un jour Ali-Baba achevait de couper sa charge de bois lorsqu'il distingua une troupe de cavaliers qui s'avançaient dans sa direction. Craignant d'avoir affaire à des voleurs, il abandonna ses ânes et monta sur un gros arbre touffu.

Les cavaliers mirent pied à terre, ils étaient quarante. Le chef de la bande se dirigea vers un rocher situé près du gros arbre où Ali-Baba s'était réfugié, écarta les broussailles et prononça :

« Sésame, ouvre-toi ! » Aussitôt, une porte s'ouvrit, les brigands s'y engouffrèrent, le chef entra le dernier et la porte se referma sur lui.



هەبوو نەبوو، لە یەکێک لە شارەکانی ئێران، دووو برا هەبوون بە ناوەکانی قاسم و علی بابا. قاسم دەوڵەمەند بوو بەڵام عەلی بابا هەژار بوو. بۆ بژێوی ژیانی خۆی و منداڵەکانی، لە دارستانی دراوسێیان داری ئەبڕی، وە بۆ فرۆشتن دەیهێنا بۆ شار، وە لە سەر سێ گوێدرێژەکەی کە هەموو سامانی بوون باری دەکرد.



ڕۆژێکیان کە عەلی بابا خەریکی بار کردنی دارە بڕاوەکان بوو بینی کە گروپێکی ئەسپ سوار بەرەوڕووی دێن. لە ترسی ڕووبەڕوو بوون لە گەڵ دزەکان گوێدرێژەکانی جێ هێشتت و چووە سەر دارێکی گەورەی ئەستوور.

ئەسپ سوارەکان کە چل نەفەر دەبوون لە ئەسپەکانیان دابەزین. سەرۆکی باندەکە بەرەو بەردێکی نزیک لەو دارەی عەلی بابا خۆی لێ حەشار دابوو ڕۆیشت، پوش پەڵاشەکەی لا برد وە وتی:

«کونجی، بیکەرەوە! » یەکسەر، دەرگایەک کرایەوە، چەتەکان چوونە ناوی، سەرۆکی چەتەکان دوا کەس چووە ژوورەوە و دەرگا دووبارە لە سەری داخرایەوە.

Après un bon moment, la porte se rouvrit, livrant passage aux quarante voleurs. Quand ils eurent tous défilé, le chef dit solennellement : « Sésame, referme-toi ! » Et la porte se referma.

Sur ce, chacun enfourcha son cheval, et la bande disparut. Aussitôt Ali-Baba quitta sa cachette, écarta les broussailles et découvrit une porte. Il se rappelait la phrase magique :

« Sésame, ouvre-toi ! » prononça-t-il.

Instantanément, la porte s'ouvrit et Ali-Baba aperçut une immense grotte, emplie de marchandises et surtout de pièces d'or et d'argent empilées dans de grands sacs de cuir. Sans perdre de temps, il réunit autant de sacs d'or que pouvaient en porter ses trois ânes. Quand ils furent chargés, il prononça la formule magique :

« Sésame, referme-toi ! » Et la porte obéit.

Content de son aubaine, Ali-Baba revint chez lui et, devant sa femme, vida le contenu des sacs, qui fit un gros tas d'or. Celle-ci désireuse d'évaluer ce trésor, alla demander à la femme de Kassim de lui prêter une mesure ; mais cette dernière désireuse de savoir quelle sorte de grain la femme d'Ali-Baba entendait mesurer, enduisit le dessous de la mesure d'une légère couche de suif.



دوای ماوەیەکی کەم، دەرگا کرایەوە، چل چەتەکە لێی تێپەڕین. وە کاتێک کە هەموویان بە تەووای لە ئەشکەوتەکە دەرچوون، بە دەنگێکی سامناک وتی: « کونجی، دایبخە! » وە دەرگا داخرا.

لەگەڵ ئەمەش، هەریەک سوار ئەسپەکەی خۆی بوو، وە باندەکە ون بوو، عەلی بابا ش یەکسەر حەشارگەکەی جێ هێشت، وە پوش و پەڵاشەکەی وەلا ناو وە دەرگایەکی بۆ دەرکەوت. ئەو دەستەواژە سیحراویەکەی دووبارە کرد:

« کونجی، بیکەرەوە! » ئەو وای وت.

دوای کەمێک، دەرگا کرایەوە و عەلی بابا ئەشکەوتێکی گەورەی بۆ بە دیار کەوت، پڕ بوو لە شت و مەک و لە سەروی هەمووشیان پارچە زێڕ و پارەیەکی زۆر کە لە ناو جانتای چەرمی کرابوون. بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، وە بەقەد توانای سێ گوێدرێژەکەی جانتای زێری کۆ کردەوە. کاتێک جانتاکانی باری گوێدرێژەکان کرد، هاوکێشە سحراویەکەی وت:

« کونجی، دایبخەوە! » وە دەرگاش گوێڕایەڵی کرد.

عەلی بابا دڵخۆش بە دەستکەوتەکەی، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ، شتەکانی ناو جانتاکانی لە بەرامبەر هاوسەرەکەی بەتاڵ کرد، کە کۆمەڵێکی گەورەی زێڕی لە سەریەکی لێ دروست کردبوو. هاوسەرەکەی کە حەزی ئەکرد نرخی گەنجەکە بزانێت، چوو داوای لە هاوسەری قاسم کرد کە تەرازوویەکی بە قەرز بداتێ؛ بەڵام ئەو حەزی دەکرد بزانێ هاوسەری عەلی بابا چ جۆرە دانەوێڵەیەکی پێ ئەکێشێت، هەر بۆیە هەندێک چەوری نەهەنگ کە بۆ دروست کردنی مۆم بەکار دێت کردە ژێر تەرازووەکە.

En rentrant chez elle, la femme d’Ali-Baba posa la mesure sur le tas d’or, qu’elle se mit en devoir d’évaluer, puis, reporta celle-ci à sa belle-sœur. Le premier soin de la femme de Kassim fut de regarder le dessous de la mesure ; et quelle ne fut pas sa surprise en voyant une pièce d’or attachée à la couche de suif. Son mari ne fut pas plus tôt auprès d’elle qu’elle le mit au courant de sa découverte. Aussitôt Kassim alla trouver son frère qui, cédant à son bon naturel, l’instruisit des paroles indispensables pour pénétrer dans la grotte et pour en sortir.

Le lendemain, de bon matin, Kassim quitta sa maison avec toute une troupe de mulets chargés de grands coffres pour s’emparer du trésor. « Sésame, ouvre-toi ! » prononça-t-il quand il eut trouvé la porte. Elle s’ouvrit, puis se referma dès qu’il fut entré.

Kassim tomba dans une profonde admiration, en face des richesses accumulées en ce lieu. Puis s’emparant d’autant de sacs d’or monnayé qu’il put en porter, il se dirigea vers la porte pour sortir, mais il ne se souvint plus de la phrase exacte et dit : « Orge, ouvre-toi ! »



که گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، هاوسەری عەلی بابا تەرازووەکەی لە سەر کۆمەڵە زێڕەکە دانا، پاش کێشانی زێڕەکان، تەرازووەکەی بۆ هاوسەری قاسم گەڕاندەوە. یەکەم شت کە هاوسەری قاسم کردی سەیر کردنی ژێرەوەی تەرازووەکە بوو؛ هیچ شتێت سەرنجی رانەکێشا جگە لە پارچەیەک زێڕ کە بە چەوری نەهەنگەکە نووسا بوو. ئەو دۆزینەوەکەی بە مێردەکەی کە زۆر لێی دوور نەبوو نیشان دا. هەر زوو قاسم چوو بۆ ئەوەی براکەی بدۆزێتەوە کە، خاوەنی سروشتێکی باشە، عەلی بابا ئەو وشانەی فێر کرد کە پێویستە بۆ چوونە ژوورەوە و دەرچوون لە ئەشکەوتەکە.

بەیانی ڕۆژی دواتر، قاسم بە هەموو هێسترەکانی کە جانتای زۆر گەورەی لێ بار کردبوون بۆ کۆ کردنەوەی گەنج ماڵەوەی جێهێشت. « کونجی، بیکەرەوە!» ئەمەی وت کاتێک دەرگاکەی دۆزیەوە. دەرگاکە کرایەوە وە دوای ئەوەی کە چووە ژوورەوە بە سەری داخرا.

قاسم واقی وڕما، لەبەرامبەر ئەو هەموو سامانەی لەو شوێنە کۆبوو بوو. دواتر کۆمەڵێکی زۆر جانتای زێڕی کۆکردەوە کە لە توانای بوو بیبات، ئەو بەرەو لای دەرگاکە چوو بۆ ئەوەی دەربچێت، بەڵام ئەو بەتەواوی دەستەواژەکەی لە بیر نەمابوو وە وتی: « جۆ، بیکەرەوە! »

La porte ne s’ouvrit pas. Kassim en conçut un tel effroi qu’il lui fut impossible de retrouver le mot magique. Soudain, il perçut le bruit d’un galop de chevaux. Il s’avança tout près de la porte et, dès qu’elle s’ouvrit, sortit si brusquement qu’il renversa le chef des voleurs ; mais les brigands se jetèrent sur lui, et l’exterminèrent sans pitié. Ils pénétrèrent ensuite dans leur repaire et remirent en place les sacs abandonnés par Kassim, sans s’apercevoir qu’il en manquait d’autres. Puis, ils coupèrent en quatre le cadavre et retournèrent à leurs exploits.





دەرگا نەکرایەوە. قاسم ترسێک دایگرتبوو کە دۆزینەوەی وشە سحراویەکەی لێ مەحاڵ کردبوو. لە ناکاو، گوێی لە دەنگی پێی ئەسپ بوو. بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت، دوای ئەوەی کە دەرگاکە کرایەوە، بە خێرایەکی زۆر دەرچوو لەوکاتەیا سەرۆکی دزەکانی خستە سەر زەوی؛ بەڵام چەتەکان ، بەوپەڕی بێ بەزەیی کەوتنە گیانی. هەموویان پێکەوە چوونە ناو حەشارگەکە وە سەیری ئەو شوێنەیان کرد کە قاسم جانتاکانی لێ جێهێشتبوو، بێ ئەوەی سەرنج بدەنە شتە دیار نەماوەکانی تر. دواتر، لاشەکەیان کردە چوار بەش وە گەڕانەوە بۆ سەر کارەکەیان.



Cependant, à la nuit close, la femme de Kassim, ne voyant pas revenir son mari, s’alarma et alla chez Ali-Baba qui partit immédiatement avec ses trois ânes. En arrivant près du rocher, il aperçut une large tache de sang devant la porte. Il prononça les paroles miraculeuses, la porte s’ouvrit et il vit le corps de son frère affreusement dépecé. Il réunit ses restes en deux paquets, qu’il chargea sur un de ses ânes, en les dissimulant avec du bois. Sur les deux autres bêtes, il mit des sacs pleins d’or, et reprit le chemin de la ville.

Il laissa à sa femme le soin de décharger les deux ânes qui portaient l’or et conduisit le troisième chez sa belle-sœur. Il fut reçu par Morgiane, une esclave adroite et ingénieuse.





هەرچۆنێک بێت، شەو داهات، خێزانی قاسم، کە لە نەهاتنەوەی هاوسەرەکەی نیگەران بوو، چوو بۆ لای عەلی بابا ، ئەویش بە خێرای لە گەڵ سێ گوێدرێژەکەی بەرێ کەوتن. لە گەڵ گەیشتنی بۆ لای تاشە بەردەکە، ئەو پەڵەیەکی خوێناوی گەورە لە بەرامبەر دەرگاکە بۆ بە دیار کەوت. وشە سحراویەکەی وت، دەرگاکە کرایەوە وە بینی کە لاشەی براکەی بە شێوەیەکی دڕندانە پارچە پارچە کراوە. ئەو ئەو دوو کیسەی کە مابوون کۆی کردەوە، وە لە یەکێک لە گوێدرێژەکانی باری کرد، وە بە دار دایانی پۆشی. لە سەر دوو گوێدرێژەکەی تر، دوو جانتای پڕ لە زێڕی بار کرد، وە ڕێگای شاری گرتە بەر.

باری دوو گوێدرێژەکەی کە زێڕی لە خۆ گرتبوو لای هاوسەرەکەی جێهێشت بۆ ئەوەی ئاگای لێیان بێت وە باری گوێدرێژی سێیەمی بردە ماڵی براژنەکەی. عەلی بابا گەیشتە "مەرجانە" کە کەنیزێکی زیرەک و بلیمەت بوو. .



— Morgiane, lui dit-il, ces deux paquets renferment le corps de ton maître, et cependant il faut que nous le fassions enterrer comme s’il était mort de sa belle mort.

L’esclave alla aussitôt chez un apothicaire, pour chercher une certaine tablette au pouvoir souverain dans les maladies les plus dangereuses.

— Qui donc est souffrant chez votre maître ? demanda l’apothicaire.

— Hélas, répondit-elle, en soupirant profondément, c’est mon bon maître, Kassim lui-même, il ne parle plus, ne mange plus, et personne ne comprend rien à sa maladie !

Le lendemain, Morgiane revint chez ce même apothicaire et demanda un remède qu’on ne donne qu’aux mourants. D’autre part, on vit Ali-Baba et sa femme aller et venir de leur maison à la maison de Kassim, et leur attitude décelait une grande affliction. On ne fut donc pas surpris outre mesure, vers le soir, en entendant les cris lamentables de la femme de Kassim et surtout de Morgiane, qui faisaient connaître ainsi la mort de leur maître.

À l’aube du jour suivant, l’esclave alla trouver un vieux savetier, Baba-Mustafa, dont la boutique était toujours ouverte avant toutes les autres, et le conduisit chez Kassim, après lui avoir bandé les yeux à mi-chemin. Elle ne retira le mouchoir que dans la chambre où gisait la dépouille de son maître.



- عەلی بابا وتی: ، مەرجانە، ئەم دوو کیسە لاشەی گەورەی تۆی تێایە، وە ئەبێت بە شێوەیەک بینێژین کە وای نیشان بدەین کە بە مەرگی سروشتی مردووە.

کەنیزە زیرەکەکە یەکسەر چووە لای دکتۆرێک، بۆ گەڕان بە دوای ئەو دەرمانانەی کە بە کاردێت بۆ نەخۆشییە هەرە مەترسی دارەکان.

- دکتۆر وتی: " لە چ نەخۆشیەک ئازار دەکێشێت؟ ".

- کەنیزەکە وەڵامی دایەوە ، بە داخەوە، (هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی)، گەورەی من، قاسم، چیتر قسە ناکات، چیتر ناخوات، وە کەس لە نەخۆشیەکەی تێ ناگات!

بۆ بەیانییەکەی، مەرجانە، چووە لای هەمان دکتۆر وە داوای لێکرد کە دەرمانێکی بداتێ کە دەیدات بەوانەی نزیکن لە مەرگ. لە لایەکی تر، ئەو عەلی بابا و هاوسەرەکەی بینی کەوا دەرۆیشتنە ماڵی قاسم، وە لە هەڵسوکەوتیان خەمێکی گەورە دیار بوو. جێی سەرسوڕمان نییە، کە نزیک ئێوارە، دەنگی گریانی خەمناکی هاوسەری قاسم و بە تایبەت مەرجانە، کە ئاگاداری مەرگی گەورەکەی بوو ببیسترێت.

لە سپێدەی ڕۆژی دواتر، کەنیزەکە چوو بۆ لای بەرگدوورێکی پیر بەناوی، بابا مستەفا، کەدوکانەکەی هەمیشە بەرووی خەلک کراوە بوو، وە دواتر مەرجانە بابا مستەفای لە نیوەی ڕێگا بە چاو بەستراوی بردەماڵی قاسم. ئەو پەڕۆکەی چاوی لابرد لەو ژوورەی کە جەستەی گەورەکەی لێ درێژ کرا بوو.



— Baba-Mustafa, dit-elle alors, je vous ai amené ici pour coudre les quatre pièces que voilà. Dépêchez-vous, quand vous aurez terminé, je vous donnerai trois pièces d’or.

Quand le travail fut achevé, elle recommanda à Baba-Mustafa de garder le secret, lui rebanda les yeux et l’accompagna jusqu’à l’endroit où elle lui avait mis le mouchoir en l’amenant. Là, elle ôta le bandeau et laissa aller le vieillard.

Le corps de Kassim fut enseveli avec le cérémonial habituel et, quelques jours plus tard, Ali-Baba s’installa dans la maison de son frère.





- مەرجانە پێی وت، بابا مستەفا ، من تۆم هێناوەتە ئێرە ئەم چوار پارچەیەی ئێرەم بۆ بدوری. پەلە بکە، کاتێک کە تەواو بووی، من ٣ پارچە زێڕت دەدەمێ.

کاتێک کە کارەکە تەواو بوو، بە بابا مستەفای وت کە ئەم نەهێنیە بپارێزێت، چاوەکانی بەست و ئەوی بردە هەمان ئەو شوێنەی کە چاوانی بە دەستماڵ بەستیبوو. لەوێ، چاوبەستەکەی لابرد و ڕێگەی دا پیاوە پیرەکە بڕوات.

تەرمی قاسم بە مەراسمێکی ئاسایی بە خاک سپێردرا وە، چەند ڕۆژ دواتر، عەلی بابا لە ماڵی براکەی نیشتەجێ بوو.



Quand les quarante voleurs revinrent à leur repaire, ils furent désagréablement surpris en s’apercevant que le corps de Kassim avait disparu et que le nombre de leurs sacs avait sensiblement diminué.

— Le voleur que nous avons châtié n’était pas le seul à connaître notre secret, dit le chef des brigands. Il faut donc qu’après avoir exécuté l’un nous exécutions l’autre. La mort étrange de celui que nous avons exterminé n’a pas dû passer inaperçue dans la ville, il faudrait donc recueillir les bruits qui circulent à ce sujets, savoir le nom de notre victime et connaître sa demeure. Celui de vous qui se chargera de cette tâche délicate devra se soumettre à la peine de mort, dans le cas où il commettrait une erreur capable de causer notre ruine à tous.





کاتێک چل چەتەکە گەڕانەوە بۆ حەشارگەکەیان، سەریان لەوە سورما بەوەی کە تەرمی قاسم ون بووە لە گەڵ ژمارەیەک لە جانتاکانیان کەمی کردووە.

- سەرۆکی چەتەکان وتی: تەنها ئەو دزەی کە ئێمە سزامان دا بە نهێنی ئێمە نازانێت. کەوایە ئێمە یەک لە دوای یەک لە سێدارە ئەدرێین. ئایا مردنی نامۆی ئەو پیاوەی کە ئێمە لە ناومان برد لە شار درکی پێ ناکرێت؟، پێویستە چاوەرێیی ئەو دەنگۆیانە بین کە لەم بارەیەوە بڵاو ئەبێت، وە زانینی ناوی قوربانیەکە وە ماڵی ئەو. وە ئەوەی کە ئەم بەرپرسایەتی ئەم کارە دەگرێتە ئەستۆ پێویستە ئەو کەسە بە بێ دەنگی بە سزای خۆی بگەیێنێت، لە دۆخێک دا ئەگەر هەڵەیەک ڕوو بدات گیانی هەموومان ئەکەوێتە مەترسیەوە.

Aussitôt l’un des brigands s’avança et se déclara prêt à entreprendre cette enquête. Il se déguisa et gagna la ville, où il entra au petit jour. Une seule boutique était ouverte, celle de Baba-Mustafa ; il s’y présenta à tout hasard.

— Brave homme, dit-il après lui avoir souhaité le bonjour, vous vous mettez au travail de bien bonne heure… Cependant vos yeux ne doivent plus être assez bons pour que vous puissiez coudre !

— Il n’y a pas bien longtemps, répondit le savetier, j’ai cousu un mort en un endroit où il ne faisait pas beaucoup plus clair qu’en ce moment-ci !

Persuadé qu’il était en bonne voie, le voleur tira une pièce d’or de sa poche et, la remettant à Baba-Mustafa, le pria de lui indiquer dans quelle maison il avait cousu le mort.

— Cela m’est impossible, dit Baba-Mustafa, pour la bonne raison qu’on m’a bandé les yeux, à un certain endroit du chemin ; de là on m’a conduit dans la maison, et l’on m’en a ramené de la même manière.



یەکسەر یەکێک لە چەتەکان هاتە پێشەوە و ئامادەیی خۆی بۆ ئەم کارە ڕاگەیاند. جل و بەرگی خۆی گۆڕی و بەیانی زوو گەیشتە شار. تەنها دوکانی بابا مستەفا کراوە بوو؛ بە شێوەیەکی شیاو خۆی ناساند.

- چەتەکە  پاش سڵاو کردن وتی: پیاوی ئازا، تۆ زۆر زوو هاتووی بۆ سەر کار ... سەرای ئەوەش چاوەکانت پێویستە زۆر باش بن بۆ ئەوەی دروومان بکەی!

- بەرگدروو وەڵامی دایەوە: بۆ ماوەیەکی درێژ وا نابێت، من جەستەیەکی مردووم دووریەوە لە شوێنێک کە لە ئێستا ڕوونتر نەبوو!

چەتەکە دڵنیا بوو کە بۆ شوێنێکی دروست هاتووە، پارچەیەک زێری لە گیرفانی دەرهێنا وە، دایە بابا مستەفا، تکای لێ کرد کە ئەو خانووەی کە مردووەکەی لێ دووریوەتەوە پێ پیشان بدات.

- بابا مستەفا وتی، ئەمە مەحاڵە، چوونکە من چاوەکانم لە بەشێک لە ڕێگاکە بەسترابوو؛ وە لەوێوە منی بردە ئەو خانووە وە بە هەمان شێوەش منی گەڕاندەوە.



— Écoutez, reprit le voleur ; venez avec moi jusqu’à l’endroit où l’on vous a bandé les yeux. Je vous les banderai à mon tour, et sans nul doute, vous vous souviendrez alors des tours et des détours qu’on vous fit prendre. Voici d’ores et déjà une autre pièce d’or.







- گوێ ڕاگره، چەتەکه ئەمەی وت؛ لەگەڵم وەره بۆ ئەو شوێنەی کە چاوەکانت لێی بەسترا. منیش چاوانت ئەبەستمەوە ، وە بە بێ هیچ دوو دڵیەک، تۆ ئەو سوران و هاتوو چووانەت کە ئەو پێتی کردووە بە بیر دێت. ها بیگرە دانەیەک لەو پارچە زێڕانە.



Baba-Mustafa ne put résister à la tentation et conduisit le voleur devant la maison de Kassim, qui appartenait maintenant à Ali-Baba. Le brigand traça hâtivement une marque à la craie sur la porte, puis, retirant le mouchoir qui bandait les yeux du savetier :

— Sais-tu qui habite en cette maison ?

— Je ne suis pas du quartier, répondit Baba-Mustafa, et ne puis par conséquent vous renseigner…

Le voleur remercia le vieillard et ils se séparèrent. Presque aussitôt, Morgiane sortit de la demeure d’Ali-Baba. Elle aperçut la marque tracée sur la porte.

— Qu’est-ce que cela signifie ? pensa-t-elle. Dans quel but a-t-on fait cette marque ? En tout cas on ne saurait prendre trop de précautions.

Toujours avisée, elle marqua de la même façon et au même endroit, avec de la craie, les deux ou trois portes qui précédaient et suivaient celle de la maison d’Ali-Baba, et qui étaient absolument semblables. Elle n’en parla ni à son maître, ni à sa maîtresse.

Pendant ce temps, le voleur avait rejoint sa troupe dans la forêt et sans perdre de temps ils entrèrent dans la ville. Le chef des voleurs, guidé par celui qui avait dirigé l’enquête, arriva devant la première porte marquée par Morgiane.



بابا مستەفا لە بەرامبەر ئەو وەسوەسەیە خۆی پێ رانەگیرا وە چەتەکەی بردە لای ماڵی قاسم، کە ئێستا بۆتە هی عەلی بابا. چەتەکە بە پەلە بە تەباشیرێک دەرگاکەی نیشان کرد، دواتر، ئەو پەڕۆیەی کە چاوی بەرگدوورەکەی بەستبوو کردەوە:

- ئەزانی کێ لەم خانووە ئەژێت ؟
- من خەڵکی ئەم گەڕەکە نیم، بابا مستەفا وای وەڵام دایەوە، هەربۆیە ناتوانم زانیاریت لە بارەوە بدەمێ …

چەتەکە سوپاسی پیرە پیاوەکەی کرد و لە یەک جیابوونەوە. هەرکەمێک دوای ئەوە مەرجانە لە خانووی عەلی بابا هاتە دەرەوە. ئەو بینی کە بە هێمایەک دەرگاکە دەست نیشان کراوە.

- ئەمە مانای چییە؟ (مەرجانە بیری کردەوە). بە چ مەبەستێک ئەم نیشانە دانراوە؟ هەرچۆنێک بێت ئێمە ئەبێت زۆر وریا بین.

وەک هەمیشە زیرەکانە، ئەو بە هەمان شێوە وە لە هەمان شوێن بە گەچ دوو یان سێ دەرگای پێش و دوای ماڵی عەلی بابای نیشان کرد، کە بە تەواوی وەک یەک وابوون. وە لەوبارەیەوە نە بە گەورەکەی نە بە خانمەکەی هیچی نەوت.

لەم کاتەدا، چەتەکە پەیوەندی بە باندەکەی کرد لە دارستان، وە بە بێ کات بە فیڕۆ دان چوونە ناو شار. سەرۆکی چەتەکان، لە لایەن ئەو کەسەی کە بۆ لێکۆڵینەوە لەم بارە نێردرابوو ڕێی پێ نیشان دەدرا، گەیشتنە یەکەم دەرگا کە لە لایەن مەرجانە نیشان کرابوو.



— C’est ici ! dit-il à son maître.

Mais comme ils continuaient à chevaucher, afin de ne pas attirer l’attention sur eux, le chef fit remarquer à son sous-ordre que les quatre ou cinq portes suivantes portaient la même marque.



— Pourtant, capitaine, je n’en ai marqué qu’une seule ! Malheureusement, il m’est impossible de la distinguer des autres.





- ئێرەیە! بە گەورەکەی وت.

بەڵام بۆ ئەوەی سەرنجی کەس بە لای خۆیان ڕانەکێشن لە سەر ئەسپەکانیان هاتنە خوارەوە، سەرۆکی چەتەکان بە نیگایەک تێبینی ئەوەی کرد کە چوار تا پێنج دەرگای لە دوای یەک هەمان نیشانەیان لەسەرە.



- لە گەڵ ئەوەشدا، سەرۆک، من لە یەک دەرگا زیاترم نیشانە نەکردبوو ! بەداخەوە، بۆ من جیا کردنەوەی نیشانەکان لە یەک مەحاڵە.

L’entreprise ayant avorté, les quarante voleurs revinrent dans la forêt ; séance tenante, le conducteur de l’enquête eut la tête tranchée. Aussitôt l’un d’eux proposa de reprendre la tâche de celui qui venait de périr, et il s’en fut à la ville.

Tout se passa de la même manière que la première fois : il corrompit Baba-Mustafa, qui le conduisit à la demeure d’Ali-Baba. Comme son prédécesseur, il fit une marque à la porte mais, au lieu d’employer de la craie, il la traça au crayon rouge et dans un endroit moins apparent.

Comme la veille, Morgiane sortit de la maison quelques instants après et, quand elle y rentra, la marque rouge frappa sa vue. Elle s’empressa d’aller marquer les portes voisines.

La tentative des brigands échoua de nouveau, et ils se retirèrent dans la forêt où le voleur qui avait commis la méprise subit le même châtiment que son camarade.

Le chef de la bande résolut alors de conduire lui-même l’enquête. Quand Baba-Mustafa l’eut amené devant la maison d’Ali-Baba, il l’examina si minutieusement qu’il fut bien sûr de la reconnaître.



کردارەکەیان سەری نەگرت، چل چەتەکە یەکسەر بەرەو دارستان گەڕانەوە؛ یەکسەر، ئەو کەسەیان لە سێدارە دا کە بۆ لێکۆڵینەوە ناردبوویان. هەرزوو یەکێک داوای کرد کە ئەو ئەرکە بەو بسپێرێت لە شوێنی ئەو کەسەی لە سێدارە درا، وە بەرەو شار ڕۆیشت.

هەموو شتێک بەهەمان شێوەی یەکەم جار بەرەو پێش چوو: ئەو بەرتیلی دایە بابا مستەفا، بۆ ئەوەی بۆ ماڵی عەلی بابای ببات. بە هەمان شێوەی کەسەکەی پێشتر دەرگاکەی نیشان کرد بەڵام، لە جیاتی تەباشیر، قەڵەمی سوری بەکار هێنا بۆ نیشان کردنی وە لە شوێنێک کە کەمتر دەبینرا.

وەک پێشتر، مەرجانە دوای کەمێک لە خانوەکە هاتە دەرەوە وە، کاتێک کە هاتەوە ژوورەوە، هێمایەکی سور سەرنجی ڕاکێشا. مەرجانە بەپەلە ڕۆیشت وە لە سەر دەرگای دراوسێکانیشی هەمان هێمای کێشا.

سەر لە نوێ هەوڵی چەتەکان بێ ئاکام بوو، وە گەڕانەوە بۆ ناو دارستان بۆ هەمان شوێن کە دزە خەتابارەکەیان لە سێدارەدا وە ئەویشیان بە هەمان شێوەی هاوڕێکەی بە سزای خۆی گەیاند.

سەرۆکی باندەکە بڕیاری دا کە خۆی ئەم ئەرکە بە ئەنجام بگەیێنێت. کاتێک بابا مستەفا ئەوی بردە لای ماڵی عەلی بابا، سەرۆکی چەتەکان ماوەیەک سەیری خانووەکەی کرد بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە خانووەکە دەناسێتەوە.

Ses hommes l’attendaient dans la grotte. Il les chargea d’acheter dix-neuf mulets et trente-huit outres dont une seule remplie d’huile. Dans chacune des trente-sept outres vides frottées d’huile à l’extérieur, afin que personne ne doutât qu’elles ne fussent pleines, le chef fit entrer un des voleurs et conduisit le convoi tout droit à la maison d’Ali-Baba. Justement celui-ci prenait le frais à sa porte, après le dîner.

— Seigneur, lui dit-il, j’arrive de bien loin avec ce chargement d’huile que j’irai vendre demain au marché. Il est tard, je ne sais où me loger et je vous serais très obligé, si cela ne vous dérange pas trop, de vouloir bien me recevoir chez vous !





پیاوەکانی لە ئەشکەوتەکە چاوەڕێی ئەویان دەکرد. سەرۆکی چەتەکان فرمانی پێیان کرد کە ١٩ هێستر لە گەڵ ٣٨ مەشکەی گەورە بکڕن وە دانەیەکیان پڕی ڕۆن بکەن. وە ٣٧ مەشکەکەی تر دەرەوەیان بە ڕۆن چەور بکەن، بۆ ئەوەی کەس گومان نەکات کە مەشکەکان ڕۆنیان تێ نییە، سەرۆکی چەتەکان  گشت دزەکانی کردە ناو مەشکەکان وە کاروانەکەی بەرەو ماڵی عەلی بابا برد. دوای نانی ئێوارە ، هەناسەیەکی تەواوی هەڵمژی لە لای دەرگاکەی کە مەبەستی بوو.

- گەورەم، سەرۆکی چەتەکان بە عەلی بابای وت، لە شوێنێکی دوورەوە هاتووم وە ڕۆنم هێناوە بۆ ئەوەی بەیانی لە بازاڕ بیفرۆشم. کات درەنگە، وە شوێنێکیش شک نابەم، زۆر پێویستیم بە یارمەتی تۆ هەیە، ئەگەر نابمە هۆی بێزار بوونت، ڕێگەم بدەن بێمە ماڵی ئێوە !



— Entrez ! répondit Ali-Baba sans hésitation, soyez le bienvenu.

Il commanda à un de ses esclaves de mettre les mulets à l'abri. Ensuite, il pria Morgiane de préparer à souper pour son hôte, et lui tint même compagnie tout le long du repas. Le dîner terminé, Ali-Baba alla à la cuisine et dit à Morgiane :

— Demain j'irai au bain avant le jour, fais-moi donc un bon bouillon, que je prendrai à mon retour !

Pendant ce temps, le chef des brigands s'était glissé dans la cour.

— Lorsque je jetterai des petites pierres de la chambre où je suis logé, dit-il tout bas à chacun, vous fendrez l'outre du haut en bas avec le couteau dont vous êtes armés. Vous en sortirez aussitôt…

Quant à Morgiane, elle mit le pot-au-feu pour faire le bouillon. Elle était en train de l'écumer, quand la lampe s'éteignit ; elle s'aperçut que sa provision d'huile était épuisée, ainsi que la chandelle. Elle résolut de prendre un peu d'huile dans l'une des outres de l'hôte de son maître.

Elle alla dans la cour et s'approcha du premier récipient ; mais elle demeura stupéfaite en entendant une voix étouffée qui demandait :

« Est-ce le moment ? »



- وەرە ژوورەوە! (عەلی بابا بە بێ دوو دڵی وتی )، بەخێر بێیت.

عەلی بابا فرمانی بە یەکێک لە خزمەتکارەکانی کرد کە هێسترەکان بباتە پەناگە. دواتر بە مەرجانەی وت کە شیو بۆ میوانەکەی ئامادە بکات، وە تا خواردنەکە تەواو دەکات لە گەڵی بێت. شیوەکە تەواو بوو، عەلی بابا چوو بۆ چێشتخانە وە بە مەرجانەی وت:

- بەیانی پێش خۆر هەڵاتن کە خۆم شوشت، سوپێکم بۆ ئامادە بکە، کە گەڕامەوە ئەیخۆم !

لەو ماوەیەدا، سەرۆکی چەتەکان، خۆی گەیاندبووە حەوشە.

- کاتێک کە لە ژوورەوە بەردی بچووکم تێگرت لەو شوێنەی کە لێی نیشتەجێم، (بە دەنگێکی نزم بە هەر یەکەیانی وت)، ئێوە لە مەشکەکان وەرنە دەرەوە وە وەک سوپایەک خۆتان پڕ چەک بکەن. ئێوە بە زووترین کات دەبێت بێن ...

سەبارەت مەرجانە، مەنجەڵی خستە سەر ئاگر بۆ ئەوەی حەمام ئامادە بکات. ئاوەکە وا بە کوڵ ئەهات، لەو کاتەیا چراکە کوژایەوە؛ بۆی دەرکەوت کە سەرچاوەی ڕۆنیان تەواو بووە هەروەها مۆمشیان نەماوە. بڕیاری دا کە هەندێک لە ڕۆنی یەکێک لە مەشکەکانی سەر هێسترەکانی میوانی گەورەکەی ببات.

چووە ناو حەوشە وە لە یەکەمین دانە نزیک بووەوە؛ بەڵام ئەو بە سەر سورمانەوە وەستا کاتێک گوێی لە دەنگێکی نزم بوو کە دەیوت: « ئایا ئێستا کاتیەتی ؟»

Morgiane s’aperçut que cette question partait de l’intérieur de l’outre ; et, sans perdre sa présence d’esprit, elle répondit tout bas : « Non, pas encore… mais bientôt ! » À chaque outre elle reçut la même question et fit la même réponse. Quand elle fut à la dernière — la seule qui fût pleine d’huile — elle en emplit son vase et revint à la cuisine, persuadée que son maître avait donné asile à trente-huit voleurs.

Elle ralluma sa lampe, prit une grande chaudière et retourna dans la cour pour l’emplir d’huile à son tour. Puis elle la mit sur un grand feu, afin que le liquide bouillît rapidement et, dans chacune des outres contenant un voleur, elle versa l’huile toute bouillante, leur enlevant ainsi la vie sans qu’ils eussent le temps de se défendre.

Elle accomplit cela sans faire le moindre bruit, après quoi elle éteignit sa lampe et se posta à la fenêtre de la cuisine, pour observer ce qui allait se passer. Elle n’était pas là depuis un quart d’heure que le chef des voleurs donna le signal convenu en jetant des petites pierres. Ne percevant aucun bruit, il se précipita dans la cour, et, approchant des outres, une odeur d’huile chaude et de brûlé lui saisit les narines. Il comprit que son entreprise venait d’échouer une fois encore et qu’il n’avait plus qu’à fuir.



مەرجانە بۆ دەرکەوت کە پرسیارەکان لە ناو مەشکەکان ئەکرێت؛ وە، بێ ئەوەی بشڵەژێ، بە دەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە : « نە، هێشتا ... بەڵام بەم زووانە کاتی دێت !» لە هەریەک لە مەشکەکان هەمان پرسیار کرا وە ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە. کە گەیشتە دواهەمین دانە– ئەو مەشکەیەی کە پڕ بوو لە ڕۆن – گۆزەکەی پڕ کرد لە ڕۆن و گەڕایەوە بۆ چێشتخانە، بۆی دەرکەوت کە گەورەکەی پەنای ٣٨ دزی داوە.

مەرجانە چراکەی داگیرساند، مەنجەڵێکی گەورەی هەڵگرت وە گەڕایەوە بۆ حەوشە بۆ ئەوەی ڕۆن بخاتە ناو یەک بە یەکی مەشکەکان. دواتر مەنجەڵەکەی کردە سەر ئاگرێکی گەورە، بۆ ئەوەی کە ڕۆنەکە بە خێرایی بکوڵێت وە، ڕۆنی تەواو سوورەوەکراوی خستە ناو هەر یەک لە مەشکەکان کە هەر دانەیەکی چەتەیەکی تێ بوو، وە یەکسەر گیانیان لە دەست دا بێ ئەوەی ماوەی بەرەنگاری کردنیان هەبێت.

مەرجانە کارەکەی بە ئەنجام گەیاند بە بێ هیچ دەنگە دەنگێک، دواتر چراکەی کوژاندەوە وە لای پەنجەرەی چێشتخانە وەستا، بۆ ئەوەی بزانێت چی ڕوو دەدات. چارەکێکی پێ نەچوو کە سەرۆکی چەتەکان بە مەبەستی ڕەزامەندی لە سەر هێرشکردن کۆمەڵێک بەردی بچوکی تێیان گرت. هیچ کاردانەوەیەک نەبوو، بە پەلە چووە حەوشە، وە، لە مەشکەکان نزیک بووەوە، بۆنی ڕۆنی سوور بوو وە سوتان هاتە لوتی. بۆی دەرکەوت دار و دەستەکەی  جارێکی تر نشوستیان هێناوە، وە جگە لە هەڵاتن چارەیەکی تری نییە.

Au retour du bain, Ali-Baba ne manqua pas de se trouver surpris en voyant les outres d'huile dans la cour. Morgiane raconta alors à son maître ce qu'elle avait fait pendant la nuit, et le mit au courant des marques tracées sur la porte.

— Tout ceci, dit-elle en terminant, est l'œuvre des brigands de la forêt… Ce que je ne m'explique pas, c'est qu'il en manquait deux… Il faut donc vous méfier encore…

— Morgiane, répartit Ali-Baba, je n'oublierai jamais que je te dois la vie… Et, en attendant, je t'affranchis de l'esclavage !





که عەلی بابا لە حەمام هاتە دەرەوە، بە دڵنیایەوە بە بینینی مەشکەی ڕۆنەکان لە حەوشەکە توشی سەر سورمان بوو. مەرجانە هەموو ئەو شتانەی کە لەماوە ئەو شەوە کردبووی بۆ گەورەکەی گێڕایەوە، وە هێمای سەر دەرگاکەشی پێ نیشان دا.

- هەموو ئەمانە، (بە مەرجانەی وت)، کاری چەتەکانی ناو دارستانە... ئەوەی بۆ من ڕوون نەبوو، ئەوەیە بۆ جاری دووەم لە بیرم کرد... پێویستە تۆ زیاتر وریا بیت...

- مەرچانە بە عەلی بابای وت، من هەرگیز ئەوە لە بیر ناکەم کە ژیانی تۆم ڕزگار کرد... وە، وە چاوەڕێی لێ دەکەم، کە لە بەندایەتی ئازادم بکەیت!



Aidé par Morgiane, Ali-Baba creusa au bout de son jardin une fosse immense, dans laquelle il enterra les corps des trente-sept voleurs, afin de ne pas éveiller l’attention de ses voisins ; puis il cacha les outres et les armes et fit vendre les mulets sur divers marchés.



Cependant le chef des voleurs ne se tint pas pour battu, et, de retour à la grotte, songea aux nouveaux moyens qu’il allait employer pour se débarrasser d’Ali-Baba. Dès le lendemain, il revint à la ville et se logea dans un khan (bazar), où il transporta de riches étoffes et des toiles fines qu’il trouva dans son repaire de la forêt. Puis il loua une boutique vis-à-vis de celle occupée naguère par Kassim et actuellement par le fils d’Ali-Baba.



مەرجانە یارمەتی عەلی بابای دا بۆ هەڵکەندنی چاڵێکی گەورە لە باخچەکەی، بۆ ئەوەی سەرنجی دراوسێکانیان ڕانەکێشن؛ لاشەی ٣٧ چەتەکەی خستە ناو چاڵەکە، دواتر مەشکە و چەکەکانی شاردەوە وە هێسترەکانی لە بازاری جیواز فرۆشت.



لە گەڵ ئەوەشدا سەرۆکی چەتەکان هیچ لێدانێکی بەرنەکەوت، وە گەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، بیری لە ڕێگایەکی نوێ ئەکرد بۆ لە ناو بردنی عەلی بابا. ڕۆژی دواتر، گەڕایەوە بۆ شار وە لە خان بازار جێگیر بوو، ئەو شوێنەی کە ئەو قوماشی گرانبەها وە جل و بەرگی نایابی لێ دەگواستەوە لە ناو حەشارگەکەی لە دارستان. دواتر دوکانێکی بەرامبەر بەو دوکانەی کە پێشتر قاسمی لێ بوو وە ئێستا کوڕی عەلی بابای لێیە بە کرێ گرت.

Le chef des voleurs qui se faisait appeler Khodjah Houssain, ne tarda pas à se lier avec le jeune homme. Il poussa l’amabilité jusqu’à lui faire des cadeaux et des invitations. Le fils d’Ali-Baba se crut naturellement obligé de lui rendre ses politesses. Il consulta son père, qui lui dit de s’arranger pour faire le lendemain une promenade avec Khodjah Houssain et, au retour, de l’inviter à prendre place à sa table, ce qu’il fit, mais Houssain refusa de rester à souper, prétextant qu’il ne mangeait aucun mets salé.

— Qu’à cela ne tienne, reprit Ali-Baba, je vais donner les ordres nécessaires. Et il s’esquiva pour donner de nouveaux ordres à Morgiane.

Celle-ci ne cacha pas son mécontentement et se promit bien de connaître cet homme qui ne mangeait pas de sel. Dans ce but, elle aida Abdallah, l’esclave d’Ali-Baba, à porter les plats sur la table et elle reconnut tout de suite, malgré son déguisement, le chef des quarante voleurs, qui dissimulait un poignard sous son habit.





سەرۆکی چەتەکان کە خۆی ناو نابوو خاجە حوسین، هەر زوو پەیوەندی لە گەڵ پیاوە گەنجەکە دروست کرد. ئەو زۆر لە گەڵی میهرەبان بوو تەنانەت دیاری بۆ دەبرد وە داوەتیشی دەکرد. سروشتی خاجە وای لە کوڕەکەی عەلی بابا کرد  کە بە ئەدەبەوە ڕەفتاری لە گەڵ بکات. لە گەڵ باوکی ڕاوێژی کرد، کە بەیانی ڕۆژی دواتر پیاسەیەکی لە گەڵ خاجە حوسین ڕێک بخات وە، لە گەڕانەوە، بۆ خوان داوەتی بکات، چەندی هەوڵ دا، بەڵام حوسین ڕەتی کردەوە کە شیو بخوات، بە بیانووی ئەوەی کە ئەو هیچ خواردنێک ناخوات کە خوێی تی بێت.

- عەلی بابا پێی وت، گرنگ نییە، من ئەڕۆم ڕاسپاردەی خواردنی گونجاویان ئەدەمێ. وە جێی هێشت بۆ ئەوەی ڕاسپاردەی خواردنی نوێ لە مەرجانە داوا بکات.

مەرجانە ناڕەزایەتی خۆی نەشاردەوە وە بڕیاری دا کە ئەم پیاوە باش بناسێ کە خوێ ناخوات. بۆ ئەم مەبەستە، یارمەتی عبدالله خزمەتکاری عەلی بابای دا، بۆ هەڵگرتنی قاپەکانی سەر مێزەکە وە سەرەڕای خۆ گۆڕینی سەرۆکی چل چەتەکان، کە خەنجەرێکی لە ژێر جلەکەی شاردبووەوە بەڵام مەرجانە ئەوی یەکسەر ناسیەوە.



Je m'explique, maintenant, pourquoi le misérable ne veut pas manger de sel avec mon maître*, il médite quelque mauvais coup… Heureusement, je suis là pour l'empêcher d'accomplir son dessein ! se dit Morgiane.

Elle se vêtit d'un costume de danseuse, et noua autour de sa taille une ceinture d'argent doré, où elle passa un poignard et, accompagnée d'Abdallah avec son tambour basque, pénétra dans la salle et exécuta plusieurs danses. Pour terminer, elle tira le poignard de sa ceinture et imagina des figures d'une diversité surprenante, feignant tour à tour de vouloir frapper un invisible spectateur.

Enfin, elle prit de la main gauche le tambour de basque des mains d'Abdallah, et le présenta à Khodjah tandis que, dans sa main droite, elle tenait le poignard. Khodjah Houssain avait déjà tiré sa bourse et se préparait à l'ouvrir quand Morgiane, en possession de tout son courage lui enfonça le poignard dans le cœur, si profondément que la mort fut instantanée.

* En effet, il est une tradition chez les Musulmans qui veut qu'on ne mange pas de sel avec ses ennemis.



ئێستا بۆم دەرکەت، بۆچی ئەو بەخت ڕەشە خوێی لە گەڵ گەورەکەم ناخوات*، ئەو بیر لە سەرەڕۆیی ئەکات... خۆشبەختانە، من لێرەم بۆ ڕێگرتن لە بە ئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەی! (مەرجانە وای وت).

مەرجانە جل و بەرگی سەماکەرانی لە بەر کرد، وە پشتێنێکی زێڕینی لە کەمەری بەست، وە بە خەنجەر پێش عبداللە کەوت کە تەپڵی لە دەست بوو، چووە ناو هۆڵەکە وە سەمایەکی زۆری کرد. بۆ لە کۆتایی دا، خەنجەرەکەی لە پشتێنەکەی دەرهێنا وە چەند نمایشێکی جۆراوجۆری سەرسورهێنی ئەنجام دا، وا وای دەرخست کەوا بە خەنجەر لە یەک لە یەکی بینەرە وەهمییەکانی دەدات.

لەکۆتایی دا، مەرجانە بە دەستی چەپی تەپلەکەی لە عبداللە وەرگرت، وە دایە دەستی خاجە لە کاتێکدا، لە دەستی ڕاستی خەنجەری هەڵگرتبوو. خاجە حوسین کە پێشتر جانتای پارەکەی دەرهێنابوو وە ئامادەی کردبوو بۆ کردنەوە، لەو کاتەدا، مەرجانە بە هەموو ئازایەتیەک خەنجەرەکەی لە دڵی خاجە دا، بە قوڵیەکی وا کە یەکسەر مرد.

* لە ڕاستی دا، ئەمە داب و نەریتێکە لای موسڵمانان کە خوێ لە گەڵ دوژمنەکانیان ناخۆن.



Dégrafant l’habit de Khodjah Houssain, elle montra à Ali-Baba le poignard dont il était armé.

— Comprenez-vous, maintenant, pourquoi votre hôte refusa de manger du sel avec vous ? Et ne reconnaissez-vous pas en lui le faux marchand d’huile, le chef des quarante voleurs ?

— Morgiane, répliqua Ali-Baba, je t’ai promis une récompense digne de tes bienfaits : je te choisis pour belle-fille !

Le fils d’Ali-Baba consentit volontiers à épouser Morgiane, et leurs noces furent célébrées quelques jours après.





وەک هەمیشە ڕووی خاجە حوسین ئاشکرا بوو، مەرجانە خەنجەری خاجەی بەرز کرد بۆ ئەوەی بە عەلی بابا پیشان بدا کە چەتەکە چەکدارە بووە.

- ئێستا، بۆت دەرکەوت، بۆچی میوانەکەت خواردنی خوێی لە گەڵ تۆی ڕەت کردەوە؟ وە ئایا تۆ بازرگانی ڕۆنە ساختەکە، کە سەرۆکی چل چەتەکە بوو نەناسییەوە؟

- عەلی بابا وەڵامی دایەوە، مەرجان، بەڵێنت دەدەمێ کە خەڵاتێکی شایستەت بکەم بەرامبەر چاکەکانت: من تۆم بە بووکی خۆم دیاری کرد !

- کوڕەکەی عەلی بابا ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ ئەوەی مەرجانە بخوازێت، وە ئاهەنگی زەماوەندەکەیان چەند ڕۆژ دواتر بە ئەنجام گەیندرا.

Le faux Khodjah Houssain fut enterré secrètement dans la fosse qui contenait les corps de ses trente-sept complices.

Ali-Baba, ignorant toujours ce qu’étaient devenus les deux voleurs qui complétaient la bande, se garda de retourner à la grotte enchantée. Cependant, au bout d’un an, il entreprit le voyage en s’entourant de mille précautions. Il se présenta devant la porte et prononça le : « Sésame, ouvre-toi » ; aussitôt la porte s’ouvrit et un coup d’œil lui suffit pour se rendre compte que personne n’était entré depuis la mort du chef des brigands.

Et c’est ainsi que, de père en fils, dans la famille d’Ali-Baba, on se transmit le secret de ce fabuleux trésor, grâce auquel lui et ses descendants vécurent dans le luxe et la splendeur.

**FIN**





خاجه حوسینی ساخته به نهێنی لەو گۆڕەی که لاشەی ۳۷ داروده‌سته‌كه‌ی لێ بوو نێژرا.

عەلی بابا، بۆ هەمیشه نەیزانی چی به سەر دوو چەتەکەی تر که تەواوکەری باندەکه بوون هات، خۆی پاراست  له چوون بۆ ئەشکەوته سیحراویەکە. دوای ماوەی، نزیکەی ساڵێک، به هەزار وریایی و ئاگا له خۆ بوون گەشتەکەی دەست پێ کرد. چووه بەردەم دەرگاکه و وتی: « کونجی ، بیکەوە» ؛ هەرزوو دەرگاکه کرایەوە وە نیگایەک بەس بوو بۆ ئەوی تێبگات که کەس داخڵ نەبووە له دوای مردنی سەرۆکی چەتەکان.

بەمشێوەیە، نهێنی گەنجینەی ئەفسوناوی وەک نەهێنیک له خانەوادەی عەلی بابا، له باوکەوە بۆ کوڕ، گواسترایەوە، که به هۆیەوە نەوەکانیان به خوشگوزەرانی و شکۆمەندی ژیان.

**کۆتایی**

